## زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(٨)

# خەبابی کوڕی ئەرەت

حبیب محمد سعید

مطبعة الارشاد ـ بغداد

# بسم الله الرحمن الرحيم

ئازیزەکانم ، ئەی هاوەڵە شیرینەکانی پێغەمبەری خوا ••
سەلامێکی گەرم و گوڕتان پێشکەش ئەکەم •

کاتێ کە چمکێ لە ژیانی هەر کامتان شارەزا ئـەبم ، زیاتر گەورەیی ئیسلامم بۆ دەرئەکەوێ ، کەوا ئێوەی مەرد و قارەمانی پەروەردە کردووە •• بۆیە شانازیی پێوە ئەکـەم و پێم خۆشە ـ بەپێی توانا ـ ژیانتان پێشکەش بکەم بەموسڵمانان، تا بەشکوم ـ بەکۆمەکیی خوای گەورە ـ بتوانن چاك و خراپ لەیەك جیابکەنەوە و ئیتر با چاوبەستکردن بەس بێت و کەم شیری بێ هەوێن بنێن •

# پێشـــکەش

پێشکەش بێت :

● بەو موسڵمانانەی کە ئەزانن ئیسلامی بێگەرد بەچ زەحمەت و دەردی سەریی و ئێش و ئازار و ئەشکەنجەیەك گەیشتۆتە دەستیان ..

● بەو موسڵمانانەی کە خۆیان ئەفرۆشن بە خوای گەورە تابنە هۆ بۆ هیدایەتدانی مرۆڤەکان و خۆیشیان سـەربەرزیی و ڕوو سووریی هەردوو جیهانیان دەست کەوێ ..

● بەو موسڵمانانەی کە ئەزانن هاوەڵەکانی پێغەمبـەر وەك ئەستێرە وان و بەهۆی تیشکیانەوە شەوەزەنگی ژیـــان ڕووناك ئەبێتەوە ...

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين ، الصلاة والسلام على رسولنا الامين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين ..

سوپاس بۆ تۆ خوایە وا ئەم رێبازە شیرینەت بۆ ناردووین ..

سوپاس بۆ تۆ خوایە وابڕیارت داوە ئادەمیزاد تاقی بکرێتەوە ئەوسا بکرێتە ئەمینداری ئایینە پاك و بێگەردەکەت..
سوپاس بۆ تۆ خوایە وا ئەم یاسا بێوێنەیەت نەخشە کێشاوە بۆ ژیانی ئادمیزاد ..
ئەگەر وا نەبوایە ، ئەوانەی لە نەفامیا هەڵپە ئەکەن و خوێنی هەژاران و داماوان ئەمژن ، خێرا خۆیان ئەبردە ریزی موسڵمانەکانەوە و بە بەرگی خواناسیی و پیاو چاکیی خۆیان ئەرازاندەوە ..

بەڵام سوپاس بۆ تۆ کۆمەڵی ئیماندار پێش دەست

رۆیشتنی تاقی ئەکرێتەوە و هەموو جۆرە ستەم و ناڕەوایەکی لەگەڵ ئەکرێ ، تا ئەوانەی مەبەستیان ڕەزامەندیی خوا نییە و بەرژەوەندیی ئیسلام و موسڵمانەکانیان بەرچاو نەگرتووە و توانای بەخت کردنی سەروماڵیان نییە بە هیچ شێوەیەك لە ئیسلام نزیك نەبنەوە ..

ئیسلام دەرمانی دەردەکانی مرۆڤایەتییە لە هەموو کات و شوێنێکا ، بەڵام بەمەرجێ پزیشکی شارەزا و دڵسۆز و لێهاتووی خۆی پیشکەشی بکا ..

بۆیە خوای خاوەن دانایەتیی تاقیکردنەوەی موسڵمانانی بە پێویست گێڕاوە ؛ تا لەبەرچاوی مرۆڤەکان بیسەلمێنن کەوا مان و مردنیان لە پێناوی ئیسلامدا بەخەیاڵا نایەت ، وەئەوان ئەوساتە بە تەمەن ئەزانن کە بۆ ئیسلام و لە پێناوی ئیسلاما بەختی بکەن ..

با ئاوڕێکیش بدەینەوە بۆ لای کافران ، ستەمکاران ، خوێنمژان و دوژمنانی مرۆڤایەتیی و لێیان بپرسین

بەرێژایی مێژوو جگە لەسەر شۆڕیی و خەجاڵەت و ریسوایی

چیتان دەست کـەوتـوە وا دژی هەڵگـرانی بانگی خـوا ئەوەستن ؟ وا ستەم لە موسـڵمانان ئەکـەن ؟ وا ئـازار و ئەشکەنجەی ئیمانداران ئەدەن ؟!

قوڕتان بەسەر ، سەرەنجامی پێشینە بەسەزمانەکان بـۆ ناهێننە بەرچاوتان ، تا بزانن هەمان چارەنووس چاوەڕوانی ئێوەش ئەکات ..

ئای لەو رۆژە رەشەی کە یەخەتان ئەگرێت و کەس ناگاتە فریاتان ..

قوڕتان بەسەر بۆ ئەو ڕۆژەتان کە لە نێوان خۆتانا تێك ئەچـن و کەسـتان تـاوان ناگرێتـە خـۆی

کۆمەڵی ئیماندار بەڵێنی سـەرفرازی و سەربەرزیی هەردو شاڵاوی ستەم و ئازارا ئەوەستێ چونکە شەوە زەنگی ئـەم جیهانە هەرچەندە درێژە بکێشێ هەر ئەبڕێتـەوە بـەڵام شەوەزەنگی قیامەتە وا بڕانەوەی بۆ نیە ..

کۆمەڵی ئیماندار بێ ڕباکەو بە شانازییەوە لەبەردەم جیهانی لەقـورئانی پیـرۆزا پـێ دراوە ، سـەرشـۆڕیی ر

ڕووڕەشیی و خەجاڵەتباریی ئێوەیش هەر لەوا تۆمار کراوە.

دەی کەواتە درێغیی مەکەن و ئەم دوو ڕۆژە دەستتان ئەڕوا چی ئەکەن بیکـــەن ، بزانین چیتان پێ ئەبڕێت .. موسڵمانانیش پەیمانی کۆڵنەدانیان داوە بەخوای گـــەورە و خوایش بەسە بۆکۆمەکیی ..

**نووســەر**
**نیســانی/١٩٨٢ز**
جمادی الاخـرەی/١٤٠٢ك

# ئاواتی ژیان

سەرزەویی تاریك و پڕستەم بوو •• نەفامیی باڵی ڕەشی كێشا بوو بەسەرانسەری زەوییدا •• ئیتر مەپرسە لەحاڵی ئەو ئادەمیزادە ستەم لێكراوەی كەمۆری كۆیلەیەتیی و بەندەیەتیی پیانرابوو ، كەوەك ئاژەڵێك ئەم دەست و ئەو دەستی پێ ئەكرا و ماوەی نەبوو بیر لەژیان و گوزەران و هەست و نەستی خۆی بكاتەوە ••

سەرزەویی پڕی بوو نەبەندە •• ڕێگای جۆربەجۆری نامەردانە گیرابووە بەر بۆ زۆركردنی و هەتا بازاڕی تایبەتییش هەبوو بۆكڕین و فرۆشتنی بەندەكان ••

هەركاتێ یاسای خوای گەورە لەژیانی ئادەمیزاد دوور خرایەوە ، ئەئاوا ئادەمیزادەكان هەندێكیان هەندێكیان

ئەچەوسێنەوە و بێ نرخ و بێ ماف سەیریان ئەکەن

ئوم ئەنماری خوزاعیش بەپێویستی زانی سەرێك بدات لەبازاڕی بەندە فرۆشتنەکەی مەککە ، تا بەشکوم بەندەیەکی ئازا و گورج و گۆڵی دەست کەوێ و کەڵکی لێ وەرگرێ ..

بەوردیی سەرنجی سەروشێوەی ئەو بەندانەی ئەدا کە بۆ فرۆشتن ئامادەکرابوون تا یەکێکی لێهاتوویان لێ هەڵبژێرێ ..

دڵی چووە سەر منداڵێك کە هێشتا باڵغ نەبوو بوو ، سەیرئەکا لاشەی ڕێك و تەنی دروست و زیرەکیی لە ناو چاویا ئەخوێنرێتەوە ، بۆیە خێرا پارەکەی داو لەگەڵ خۆیا هێنایەوە ..

لە ڕێگادا ئوم ئەنمار ئاوڕی دایەوە بۆ لای بەندەکە و لێی پرسیی

- ناوت چییە ؟
+ خەبباب .

– ئەی ناوی هاوکت چییە ؟

+ ئەرەت •

– خەڵکی کوێی ؟

+ نەجد •

– کەواتە تۆ عەرەبیت !!

+ بەڵی • وە لە نەوەی تەمیمم !!

– جا چیی تۆی گەیاندۆتە دەستی بەندە فرۆشـــەکانی مەککە ؟!!

+ هۆزێك لە هۆزەکانی عەرەب هێرشی هێنایە ســـەر هۆزەکەمان و ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتی بە تاڵان بردو ئافرەتـان و مناڵانی بە دیل گرت و کردنیە بەندە •• منیش یەکێـك بووم لەو مناڵانەی کە بەدیل گیـران • وا لـەوکاتەوە ئـەم دەست و ئەو دەستم پێ ئەکرێ تا گەێنرامە مەککـــە و وا کەوتوومەتە دەست تۆ ••

ئەم چیرۆکە پرستەم و ئێش و ئازارە کـاری نەکـردە سەر هەستی ئافرەتەکە •• ئافرەت سۆزی زۆرە ، بەتایبەت بۆ مناڵ و کۆرپە •• بەڵام چونکە پەروەردەی نەفامیی کراوە،

ئەوەتا هەست و هۆشی لە کارکەوتووە و تەلی سـۆزی بچڕاوە ، وا بەهیچ شێوەیەك بیر لە هەسـت و هۆشی ئـەو کوڕە و کەس و کارەکەی ناکاتەوە ..

بەڵێ تەنها بەرگی سپییە وا لەکەو پەڵەی پێوە دیـارە ، ئەگینا بەرگی تاریك و چڵکن هەست بە هیچ لەکەو پەڵەیەکی ناکرێت ..

زیـاد لـەوەی کە خەبباب ئادەمیزادێکی ستەم لێکراو بوو ، عەرەبیش بوو ؟ وە ئەبوایە سۆزی نە تەوایەتیی دڵـی ئافرەتەکەی بهێنایەتە جۆش و بەزەیی پیایا بهاتایەتەوە !!

بەڵام نەفامیی هیچی لەگەڵا ناوترێ ، چونکە هەرچی بێت بەدەمیا وشەی رووتە و بەس !

ئوم ئەنمار خەبباب ناردە لای یەکێك لە ئاسنگەرەکانی مەککە تافێری شمشێر دروست کردنی بکات ، جا چونکە زیرەك و لێهاتوو بوو بەخێرایی و بەچاکترین شـێوە فێری پیشەکەبوو . وەکاتێ کە گەورە بوو و توانای هەبوو بە تەنیا کاربکات ئوم ئەنماری خانمی دووکانێکی بۆگرت بەکرێ و

شتومەکی پێویستی بۆسەند تا بەشمشێر دروست کـــردن دەستهاتێکی باشی دەست کەوێ ..

خەبباتێ سەرگەمی کارەکەی بوو و رۆژ بەڕۆژ ناو و ئاوبانگی پیشەسازیەکەی دەرئەچوو و خەڵکیی ئەهاتن بەدەم کڕینی شمشێرەکانیەوە چونکە لە راستییدا دەست پـــاك و راستگۆ و ڕەوشت بەرز بوو ، زیاد لەوەی لـــە کارەکەیا سەرکەوتوو و شارەزابوو ..

بەڵێ خەبباب رۆژ بە رۆژ ژیریی و سەلیقەی زیاتـــر دەرئەکەوت .. بەڵێ هێشتا گەنجبوو ، بەڵام خاوەنی بیرو هۆشێکی ئێجگار تیژ بوو ..

ژیانی نەفامیی بەتەواوەتیی پەستی کـردبوو ، ئەوەبوو هەرکە لە ئیش و کارەکەی دەستی هەڵبگرتایە ئەکـــەوتە بیرکردنەوە و سەرنجدان لەو هەموو ستەم و ناڕەوایەی کە کۆمەڵی نەفامیی داپۆشیوە ..

بۆچی ئادەمیزاد وا سەرگەردان بێت ؟! چۆن ویژدانی زیندوو بەم خراپکاریانە ڕازیە ؟! تاکەی وا بەم شـــێوەیە

ژیان بەردەوام بێت ؟

دەی خۆ چاریش نییە و هەزارەهای وەکو ئەم لەم بیرەدا بژین ناتوانن کارێ بکەنە سەر شێوازی کاروانی نەفامیی •• تەنها خەم و خەفەتی بۆ ئەمێنێتەوە •

نەء ، کە ئەم کارە بەو ناکرێ ، ئاوا شەوەزەنگ ژیانی ئادەمیزادی تاریك کردووە ، هەر ئەبێ کۆتایی بێت •• هەر ئەبێ ژیان پشوویەك بدات و ئادەمیزاد رزگاری ببێت•• ئینجا ئاواتی ئەخواست ژیانی بە بەریەوە بمایە تا بەو ئامانجە گەورە بگەیشتایە و بە چاوی خۆی رووخانی قەلای ستەمکاران و رەوینەوەی تاریکیی و شەوە زەنگی بدیتایەو رۆژی رووناکی رزگاریی سەری هەلبێنایە ••

بەلام چۆن و کەی ؟

نازانێت !

تەنها ئاواتە بۆ ئەو هیوایەی کە لە دلی ئادەمیزادی چاکویستا هەیە !!

# سزای کافران و .. تۆڵەی پەروەردگار

خەبباب هەموو جارێ بیری لە ئاواتەکەی ئەکردەوە ..
دڵە پاکەکەی گڕی گرتبوو بەرامبەر ئەو ستەمەی لــــە
ئادەمیزادەکان ئەکرا کەوا یەکێکیان خۆی بوو ..

بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو لەناو ئەشکەوتی حیـراوە
ڕۆشنایی دەرکەوت ..

خوای پەروەردگار ـ جل جلالە ـ رەحمی باراندە سەر
زەویی وبەهۆی بانگـەوازی ئیسلامی و محمــدی کــوڕی
عەبدوللاوە تاریکایی و شەوە زەنگی سەرزەوی راپێچ کردو
ڕۆشنایی ڕێبازەکەی سەراپای جیهانی ڕۆشن کردەوە .

هیوای چەوساوان هاتە دیی ..
بەرنامەی شیرین و بێوێنە پێشکەش بە ئادەمیزادکــــرا .

خـــەبباب راچـڵەکیی •• دەنگ و باســـی ئایینی ڕزگارکەری کەوتە گوێ ••

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای هاشمیی ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ ڕۆشنایی بۆهاتووە ••

هەواڵی ئاسمانی بۆ هاتووە ••

پەڕاوی پەروەردگاری بۆ هاتووە ••

ئادەمیزادەکان بانگ ئـەکا بۆ سەر ڕێبازی ڕزگاریی •

ئەوەی کەزیاتر جێی بڕواو متمانەبێ موحەممەد خۆیەتی ••

چونکە بەراستیی شایانی هەڵبژاردنە ••

پێغەمبەرایەتیی هەرشیاوی خۆیەتی ••

دڵە هوشیارەکەی خەبباب داوای لێکرد بچێت بۆلای یەکەمین پیاوی مرۆڤایەتیی •• بەڵێ کەوتەرێ و گەیشـتە لای و گوێی گرت بۆ فەرمایشتی ئاسمان •• بۆ قورئانـــی پیرۆز ••

خەببابی خـاوەن دڵو هـۆش ، چـــاك دڵـی دا بــە خوێندنەوەی قورئانەکە ، کەموحەممەد ـ صلی الله علیـــە

وسلم ـ خـۆی بەدەنگی پـیرۆزی بـۆی ئەخوێنـدەوە ،
بەیەکجاری کاری کردە سەردڵو دەرونی خەبباب و خـۆی
بەخۆی ئەووت :ـ

ئای لەم فەرمایشتە بەرزە ..
ئای لەم تام و لەزەتە ..
ئای لەم داڕشتنە بێوێنەیە ..

هەموو ووشەیەکی تەڕوپاراوی ئاوی سازگارو شیرینی
لێ ئەبارێ ..

دیارە فەرمایشتی ئاسمانە ..
ئادەمیزاد ئەمەی لێ نایەت .

یەکەم ڕەوشتێ کە موحەممەدیش ـ صلی اللە علیـە
وسلم ـ پێی ناسرابێ راستگۆیی و ئەمینداریە ..
چل ساڵە لەگەڵ بەندەکانی خوادا راستگۆ و ئەمیندارە ، دەی
کەواتە ناگونجێ دوای ئەم تەمەنە زۆرە ، جگەلەراستگۆیی
و ئەمینداریی هیچ رەوشتێکی تری لێ بووەشێتەوە ..

خەبباب دڵی حەسایەوە .. ئاوی خواردەوە .. متمانەی

پەیدا کرد بەبانگی رزگاریی •• بۆیە بڕیاری دا بچێتە ریزی تێکۆشەران و ببێتە یەکێك لە قوتابیەکانی قورئــان • ئـــەو قورئانەی کە ژیانی کۆیلایەتی و زوڵم و ستەم لەگۆڕ ئەنێ

بەڵام بڕمەترسیبە ••

ژیانی ئەکەوێتە مەترسیەوە ••

ژیان •• ؟!

ژیانێ بۆ رێگای خوا بەخت نەکرێ کەی ژیانە ؟!!

سەرشۆڕییە ••

مردنــە ••

بێغیرەتیبە ••

بێ ئابڕوویە ••

نۆکەریبە ••

زەلیلیــە ••

ئای چەند خۆشە ژیان بکرێتە قوربانی رێگای خــوای گــەورە ؟!

خۆ ئەوەی دڵی نایە ژیانی پێشکەشی رێگای خوا بکات، ئەوە خاوەنی ژیان نیبە !!

بەناو خاوەنی ژیانە ، بەڵام بەسووکیی و ریســـوایی ئەیبانە سەر •• تا قەڵای ستەمکاران بپارێزێ ••

دەی خەبباب بێزاری ئەو ژیانە ئاڵۆزەیە ••

ئەوە ژیانی دەروون نزمەکانە ••

ئەوە ژیانی بێ نرخانە •• لە هەرکوێ بوو لەوێ شەن ئەکەن •• هەر رۆژە خزمەتی بتێ ئەکەن و •• دڵیان ـ بـە گۆرانیووتن بەبالآیا ـ ئەحەسێتەوە •

خەبباب ژیانێکی ئەوێ مەردانە بێت•• مایەی رووخاندنی قـەڵای ستەم و ناڕەوایی بێت •• ئەگـەر چـی ئـەو ژیانە چەند ساتێکی کەمیش بێت •• وە ئەگەرچی سـزاو ئازاری جیهانی بەسەرا برێژن •• بەمە بڕیاری شوێنکەوتنی رێبازی ڕاستیدا •• دەستی بەیماندانی بۆ پێغەمبەری ئازیز ـ صلی الله علیه وسلم ـ درێژ کرد بە دەم و بە هوشیاریی دڵەوە و بە تێگەیشتنی مێشکەوە بڵێ :

أشهد ان لا اله الا الله ••

وأن محمدا رسول الله ••

سوپاسی خـوای پەروەردگاری کـرد وا بەرنامـەی رزگاریی ئادەمیزاد و لەناوبەری ستەم و نـاڕەوایی نـارد • بەم شـێوەیە خەبباب شەشـەم پیاوێ بوو کەلەسـەر رووی زەویدا کەوتە شوێن بانگی قورئان ••
بۆیە وتراوە لە ماوەیەکا خەبباب شەشیەکی ئیسلام بووە !

جا ئایینی تازە هەروەك رۆشنایی بوو بۆ دڵە پاکەکان لەهەمان کاتا ئاگرێکی سووتێنەری جـەرگ بـڕ بـوو بـۆ ستەمکارە بەرزەوەندیی پەرستەکان • وە هەروەك دڵـــە پاکەکان سەر و ماڵیان پێشکەش کرد • ســـتەمکارەکانیش سەرو ماڵیان تەرخان کرد بۆ دژایەتیی کردن لەگـەڵیـا •• بۆیە هەریەکێ موسڵمان ئەبوو ، هەرچی لە توانایانا بووایە ، لە سزاو ئازارو دەردی سەریی ، درێغیان نەئەکرد ••

خەبباب غیرەتەکەی رێگەی نەدا موسڵمانبوونی خۆی لە قورەیش بشارێتەوە •• بۆیە دەنگ و باسی گەیشـتەوە لای ئوم ئەنماری خانمیو ئەویش ستەمکار ئاسـایی چاوی پەڕییە تەوقە سەری و چووە لای ســـیاعی کـــوڕی عەبدولعوززای بـرای تا بیبات لـەگـەڵ خـۆیاو بچنە سـەر

خەباب ، وە ئەوەندەی پێ نەچوو چەند هەرزەکارێکــی تایەفەکەشیان کەوتنە گەلیان و هەموویان پێکەوە لێــان دا بۆ دووکان سەیر ئەکەن وا خەبباب سەرگەرمی ئیشەکەیەتی سیباع لێی هاتە پێش و وتی

لە بارەی نۆوە دەنگ و باسێکمان پێ گەیشتووە بــەڵام باوەڕمان پێی نەکردووە ..

خــەبباب پرســـیی کامەیە ئەو دەنگ و باســە ؟
سیباع وتی

وا بڵاوە کە تۆ لە ئاینەکەت دەرچـــوویت و بڕوات هێناوە بەومناڵەی نەوەی هاشم ..

خەببات ـ لەسەر خۆوە ـ وتی لە ئایین دەرنەچووم ، بەڵکو ئیمانم هێناوە بەخوای تاك و تەنیـــاو بێ هاوبەش ، و بتەکانم فڕێ داوە و شایەتیم داوە کە موحەممەد بەنـــدەو پێغەمبەری خوایە ..

سیباع چی ئەبیستێ ؟!

ئەمە سیاعە وا ئەم وتەیە بەبێ پێچ و پەنا لە بەندەکەیەوە نەبیستێ ؟!

مانای بەچی ؟!

کەی بووە بەندە بێ پرسی ئاغا بیر لە چارەنووس و ژیانی و ئایین بکاتەوە ؟!

لە یاسای نەفامییدا کەی شتی وا بووە ؟!
ئەمە مەترسیی زۆری تیایە بۆ ئایینی قوڕەیش

بۆیە هەر ئەوەندە بوو وتەکانی خەبباب کەوتنە بەرگوێی سیباع و هاوەڵەکانی ، ئیتر دایان گرتەوە ، بەڵام چۆن داگرتنەوەیەك ، بەدەست لێیان ئەدا و بەلەقە دایان ئەگرتەوە و هەر چەکوش و پارچە ئاسنێکیان دەست کەوتایە تێیان ئەگرت ٠

ئەو کۆمەڵە داخ لە دڵە خوێنەخۆرە هیچ درێغییەکیان نەئەکرد و دەستیان نە ئەپاراست ، بەڵکو بە قەستی کوشت لێیان ئەدا تالاشەی پیرۆزی بەخوێن سوور بوو ، ئیتر بەرگەی نەگرت و لەژێر دەستیانا بە بێهۆشیی کەوتە سەر زەویی ٠

چیتان ئەوێ ستەمکاران ؟!
ئەو موسڵمانە چ تاوانێکی کردووە ؟!

مەگەر تاوانی ئەوە بێ وەك ئێوە بت پەرست نیەو ملکەچ و سەر شۆڕی ئەم و ئەو نیە !

مەگەر تاوانی ئەوە بێ وەك ئێوە دڵپیس و مێشـــك بەنجکراو نیە و خاوەنی دڵی سپیی و مێشکی رزگارکراوە..
مەگـەر تاوانی ئـەوەبێ وەکـو ئێوە سـتەمکار نیـە و مرۆڤێکی مافخوراوی چەوساوەی راستیی ویستە ..

ئێوەی ستەمکار-هەر با دەستتان بڕوا بەسەر لاشەدا و بتوانن پارچە پارچەی بکەن ، خۆ ناتوانن دەستکاریی دڵ و دەروونە دامەزراوەکەی بکەن و ئیمانەکەی لێ بسێنن وە وا لـــەم ژیانەدا دەستتان بەسەر موسڵمانی بێ دەسەڵاتا رۆی ؟ خـــۆ بەڵێنی قورئانە و ئەبێ لەقیامەتا سەرشۆڕ و خەجاڵەت بن .. خۆ وەنەبێ لەم ژیانەیشا تا سەر دەستتان بڕوا بەڵکو کـــە کۆمەڵی ئیماندار پێ گەیشت ئەوسا سەر زەویی پڕ ئەکـا لە خۆشیی و بەختیاریی ، تەنانەت ئێوەی نەفامیش ســـوودی

لێ وەردەگرن ، کەواتە هۆش بکەنەوە و کۆتایی بەم تاوانکاریەتان بهێنن باشترە بۆتان !!

دەنگ و باسی خەبباب و خانمەکەی سەرانسەری مەککەی پڕ کرد ..

خەڵکەکە بە بیستنی دەمیان داچەقیی .. شتی وا چۆن ئەبێت ؟

کەی بەندە توانیویەتی لە ئاغا هەڵگەڕێتەوە ؟!
ئاغا بکوژ و بڕ خۆیەتی .. ئیتر چۆن بەندە ئەوێرێ بیر لە خۆی بکاتەوە ؟!

ئینجا هێشتا نەیان بیستبوو یەکێ لە شوێنکەوتووانی موحەممەد وا بەو ئاشکراییە بێ‌ترس لە ناو خەڵکا بووەستێ و موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا بکات !!
سەردارانی قورەیش راچڵەکین ..

هەڵوێست زۆر پڕمەترسیی ئەهاتە پێش چاویان .. چونکە هەرگیز نەئەهات بەبیریانا ئاسنگەرێك ، وەك بەندەکەی ئوم ئەنمار ، کە هیچ کەس و کارو

پشتیوانێکی نییە ، بتوانێ لە خانمی هەڵگەڕێتەوە و لەژێر دەسەڵاتیا خۆی داڕنێ و بە ئاشکرا قسەی سووك بە خواکانیان بڵێ و ئایینی باوك و راپیریان بە پڕو پووچ بداتە قەڵەم ..

سەردارانی قوڕەیش لە قووڵایی دڵیانا سەلما کە ئەم رووداوە بەم شێوەیە رۆژ بەرۆژ لە پەرەسەندنایە و رۆژێکی رەش و تاریکی بە شوێنەوەیە بۆ قوڕەیش و ئایینەکەی ..

قوڕەیش چاك ئەیزانیی پەرەسەندنی ئایینی تازەو کۆبوونەوەی مافخوراوان لە دەوری ئەنجامەکەی تیاچوون و توانەوەی بیروباوەڕەکەی ئەوە ..

هەرواش بوو .. ئەم چاونەترسییەی خەبباب بووە هۆی ئەوە کەزۆر لە هاوەڵەکانی موسڵمانبوونیان ئاشکرا بکەن و بەبێ ترس بانگی سەرفرازیی بدەن بە گوێی ستەمکارە ملهوڕەکانا ..

بۆیە قوڕەیش ناچار بوو قۆڵی گلاوی هەڵماڵێ و هەموو چەکێ بخاتە کار بۆ بەربەستی رێبازی قورئان .. بۆ ئەمەش سەرداران . بەسەرۆکایەتیی ئەبووسوفیان و

وەلیدی کوڕی موغیرەو ئەبوو جەهل لە کەعبەدا کۆبوونەوەیەکیان کرد تا بیرێك لە موحەممەد و ئایینەکەی و شوێنکەوتووەکانی بکەنەوە دوای ئەوەی کەرۆژ بەرۆژ ئایینەکەی بلاو ئەبوویەوە و پشتیوانی زۆر ئەبوون ..

بەڵێ .. لەسەرەنجاما بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کەپێویستە بەزووترین کات ، تادەردەکە پەرەی تەواوی نەسەندووە ، فەلاچۆی بکەن و خۆیانی لێ رزگار بکەن ..

بڕیاریان هاتە سەر ئەمە کەهەر هۆزێك هەڵمەت بەرێتە سەر ئەوانەی کەتیایا موسڵمان بوون ، وە بەهەموو شێوەیەك سزاو ئازاریان بدات تا یا پەشیمان بنەوە یالەژێریا بمرن .. سزاو ئازاردانی خەبابیش سپێررایە سیباعی کوڕی عەبدلعوززا و خزمەکانی تابەوپەڕی بێویژدانییەوە سزای بدەن ..

جا کەگەرمای نیوەڕۆ دای ئەداو تیشکی بڵێسەداری خۆر هێرشی ئەهێنایە سەرزەویی و لەکەی گەرمو داخ ئەکرد ، خەبابیان ئەهێنایە دەرەوە و لەو گەرما

سووتێنەرەدا جلەکانیان لەبەرا دائەکەندو بە زرێی ئاسن جەڕیان ئەداو لەبەر خۆرەکە بە جێیان ئەهێشت‌و ئاویان لێ قەدەغە ئەکرد ... کەگەرما زۆری بۆئەهێناو تینوویەتیی گڕی ئەحستە دڵیەوە ، ئەهاتنەوە بۆلای پێیان ئەوت لەبارەی موحەممەدەوە چی ئەڵێیت ؟

ئەویش ـ خوالێی رازیی بێت ـ ئەیوت

بەندەو پێغەمبەری خوایە ، ئایینی هیدابەت و رێگای راستی بۆهێناوین تالەتاریکی دەرمان بێنێ‌و بمانخاتە بەر رووناکیی ..

کاتێ کەئەم تێگەیشتنی رێك و پێك و هەڵوێستی جەوانمەردانەی خۆی بۆ باس ئەکردن ؛ ئەوان ئیتر چاویان ئەپەڕییە تەوقە سەریان و بەبێ بەزەیی دایان ئەگرتەوە ، ئینجا لێیان ئەپرسی

ئەی لەبارەی لات و عوززاوە چی ئەڵێیت ؟

ئەیوت

دووبتی کەڕو کوێر و بێزیان وبێ‌کەڵکن .. ئەوانیش

بێویژدانییان ئەگەیشتە پلەیەك بەبێ بەزەیی بەردی گەرمو داخیان ئەهێناو ئەیان نووساندن بەپشتیاو هەروا ئەیـــان هێشتنەوە هەتا چەوری هەردووشانی چۆڕاوگەی ئەبەستو ئەهاتەخوارەوە

« وما نقموا منهم الا أن يؤمنوا بالله العزيز الحميد»
( البروج )

ئەوە خەبابی خواناس تاوانی چییە وای لێئەکەن ، ئەی ئەوانەی دڵتان لە دڵی دڕندەکان رەقترە ؟

دزیوجەردەیی کردووە ؟

بەرتیلی خواردووە ؟

جاسووسیی کردووە ؟

ناپاکیی کردووە ؟

ئاژاوەو دووبەرەکیی ناوەتەوە ؟

شەرواڵ پیسیی کردووە ؟

چ رەوشتێکی خراپی هەیە ؟ وەیان چ تاوانێکی کردوە؟ دیارە موسڵمانی قوتابی قورئان هیچێ لەمانەی نەکردووە

ئەمانە لەکردەوەی موسڵمان ناچن بەڵکو ئەو تەنهـا سوێنکەوتەی خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەو ئەمەش هەموو تاوانێکیەتی !! وە بەڵکو ئەو ئەمانەی نەکردووە و بە بیروباوەڕەکەیەوە قەڵاچۆی ئەم کردارانە ئەکات ، بۆیە تاوانبارە !!

ئوم ئەنماری خانمیشـ ـی وەنەبێ لەسیاعی برای بەسۆزتر بووبێ .. بەڵکو چەندقات سزای ئەدا .. خوا وای رێکخست جارێکیان پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ دای بەلای دووکانەکەی خەبابدا و ئوم ئەنماریش بەچاوەوە بوو لەگەڵ خەبابدا فەرمایشتی ئەکرد . بۆیـە لـەمەراقـدا چاوی پەرییە تەوقە سەری وبەجارێ شێت بوو و رق و قینێکی زۆری لێ هەڵگرت .

ئیتر هەموورۆژێ ئەهاتە دووکانلای خـەباب و ئاسنێکی سوور ئەکردەوە و ئەیخستە سەرسـەری خەبـاب ولای نەئەبردهەتا قرچەی پێ ئەکەوت و دووکـەڵی لـێ هەڵئەساو لەتاو ئێش و ئازارا ئەبوورایەوە ..

ئەویش لە خوا ئەپاڕایەوە تا ئەم ستەمە لە ئوم ئەنمارو براکەی قبووڵ نەکاو تۆڵەیان لێ بسێنێ ..

موسڵمانی خواناس بەدیمەن بێکەس بوو .. بۆیە ناچار بوو دان بگرێ بەخۆیا تا خوا دەروو بکاتەوە ..

تاخوا نەخشە بکێشێ ... تابگاتە فریایان .. تەنهـــا ئەوەندەی ئەتوانی شکاتی حاڵی خۆی بەرێتە لای پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ .

پێغەمبەریش لەخوا ئەپاڕایەوە بۆی تاتۆڵەی لـــەئوم ئەنمار بسێنێ ..

بەڵێ سزاو ئازاری کافران لەوزەدا نەبوو .. دنیایان کردبووە شەوەزەنگ لەبەردەم موسڵمانەکاندا .. بۆیـــە تەنها ئەو پاڵەوانانە بوون وا بەرگەی ئەو هەڵوێستە بگرن

وەنەبێ هەموو کەسێ بتوانێ خۆی لەبەردەم ئەو سزاو ئازارەدا بگرێت ، جا کە ناڕەحەتیان ئەگەیشتە ئـــەوپەڕی پلە ناچار ئەبوون دادی خۆیان بگەیەننە لای پێغەمبەری خوا

ـ صلى الله عليه وسلم ـ تا بەشکوم لای خوا ـ جل جلاله ـ بۆیان بپاڕێتەوە ..

ئەوەتا خەبباب ـ خوالێی رازی بێت ـ ئەگێڕێتـــەوە ــەلێ

هاتینە لای پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ کەوا لەسێبەری کەعبەدا شانی دادابوو ، ئێمەش دادی حاڵی خۆمانمان کرد و وتمان

ئەوە داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت ؟ ئـەوە بۆمـان ناپاڕێیتەوە ؟

جا هەڵسایـەوەو رێك دانیشـت و لەتوورەییـا دەمو چاوی سوور بوویەوەو فەرمووی :
ئەوانەی لەپێش ئێوەوە موسڵمان بوون ، پیاوێکیان ئەهێنراو چاڵی بۆهەڵئەکەنرا و مشاریان ئەخستە سەرسەری و ئەکرا بە دووکەرتەوە بێ ئەوەی ئەمەلەئاینەکەی وازی پێ بێنێ .. وە بەشانەی ئاسنین گۆشت و دەماری لە ئێسـقانەکانی جیـا ئەکرایەوە بێ ئەوەی ئەمە لە ئاینەکەی وازی پـێ بێنێ ..

وه خوا ئەم ئاینە بە شێوەیەك سەرئەخات هەتا ســوار لـە صەنعاوە بکەوێتە رێ و تەنها لەخوا بترسـێ و لەمەڕەکـانی نەوەك گورگ بیان خوات ، بەڵام ئێوە پەلە ئەکەن[1] .

بەم فەرمایشتە موسڵمانەکان تێ گەیشتن چی سـزاو ئازار دراون هێشتا هیچ نییە .. سزاو مەینـەت لە پێناوی ئیسـلاما سـنووری نییە . بەڵکو سەرانسەری ژیان پێویستە تەرخان بکرێت ..

هێشتا لە کوێتانە ؟ . ئێوە ئاوا بێ ئارام‌بن و ئاوا پـەلـە بکەن ، بەکەڵکی ئیسلام نایەن ..

ئەبێ خۆتان ئامادەی لەمە زیاتر بکەن ، چونکە هـەتا کافر دەسەڵاتی هەبێ درێغیی ناکات ، بەڵام ئەبێ ویسـت و

---

(١) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر بوو ـ صلى الله عليـه وسلم ـ وا ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی بەرچـاوی گرتبوو کەوا بەوپەڕی دامەزراوییەوە بیست وهەشت مانگ لە بەندا مایەوە بێ ئەوەی دان بنێ بـەو بیرەی موعتەزیلەدا کە ئەیوت
قورئان خەلق کراوی خوایە !! واتە ئەزەلی نییە ..

لێبڕاتی موسڵمانان لەهەموو زانین و دەسەڵاتێکی کافـــران بەهێزتربێت ، چونکە هەڵگـری ڕێبازێکی وەها بێگــەردن هەرئەبێ دەستی پۆڵایینی ستەمکاران لەبنابڕن و دەســـت کۆتایان بکەن ..

ئەمە پەندە بۆ موسڵمانەکان تا پەلەنەکەن و بەدەست ئازاری نەفامانەوە بێزار نەبن ، وە بۆ خۆ قوتارکــــردن و ئازاری نەفامان بانگی ئیســلام نەکــەنە یـاریی منـاڵان و بەهەنگاوی هەڵەشە زیان بە ئیسـلام و موســـڵمانەکان نەگەیەنن .. چونکە بانگی خوا بەئارەزووی مــــرۆڤ کێشانەی بۆ ناکرێ .. پێویســـتە هـــەنگاو بەهەنگاو و لەسەرخۆ ئیشی بۆ بکرێ و ، ئامۆژگاری لەژیانی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی وەربگرین .

موسڵمانەکان لەگەڵ خوادا ڕاستگۆ بوون بۆیە هەموو کارێکیان ئەدایە دەست ئەوو ئەوەندە بیریان لەنەخشــەو سەرکەوتن و بردنەوەی ئەم جیهانە نەئەکردەوە .. بەڵکــو هەموو ئاواتێکیان ئەوە بوو زیاتر لەخزمەتی قورئانابن و زیاتر

خوا پەرستیی بکەن ، تائەوە بوو خوا ـ جل جلاله ـ دەرووی چاکەی لێ کردنەوە و سەربەرزی هەردوو جیهانی کردن ..

ئەوە بوو کاتێ پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمانی دا بەهاوەڵەکانی تاکۆچ بکەن بۆ مەدینە ، خەبابیش یەکێ بوو لەو هاوەڵە بەڕێزانە ..

بەڵام بەر لەوەی خەبباب بەئاواتی رزگاربوون بگات و بگاتە پایەختی دەوڵەتی قورئان ، خوای گەورە بەئاواتێکی تری گەیاند ، ئەویش ئەوەبوو

خوای گەورە نزاو پاڕانەوەکەی خۆی و پێغەمبەری خۆشەویستی ـ صلی الله علیه وسلم ـ وەرگرت و نـوم ئەنماری تووشی دەردی شیاوی خۆی کرد ..

ئەوەبوو تووشی ژانەسەرێك بوو کە هەرگیز ئێش و ئازارەکانی نەبیسترابوون .. ژانەسەری چی ؟! بەدەست ئێش و ئازارەوە وەك سەگ ئەوەڕیی ..

بەڵێ .. سوپاس بۆ خوای گەورە ، ئەمە یاسایەکی هەمیشەیی خوای خاوەن سۆزو بەزەییە کەوا هەموو ستەمکارێ هەر لەجیهاناو بەرلەوەی بگا بەسزای دۆزەخ

تووشی دەردێکی وەها ئەکا کــــە ببێتە پەنــــدی زەمانــــەو لەمێژوودا ئابڕووی بچێت ••

کوڕەکانی کەوتنە ئەمسەرو ئەوسەر بۆ چارەسەریی و دەرمان کردنی •• هەموو وڵات و شـــوێنێ گــەڕان دوا دەرمانێ کەبۆیان نواند بریتیی بوو لەوەکە لەئێش‌و ئــازار رزگاری نابێ هەتا هەموو رۆژێ بەئاسنی سوورەوەکـــراو سەری گەرم نەکرێ •

ئافرەتەکە ناچار بوو هەموو جارێ کەژانەســـەرەکەی لێ بهاتایە ئەبوایە خەبباب ئاسنی ســـوورە وە کـــــراوی بخستایەتە سەر سەری هەتا بەو تێش و ئازارە ، ئازارەکەی تری لەبیر ببردایەتەوە ••

بەم شێوەیە خوای گەورە تۆڵەی خەببابی ستەم لێکراو و چەوساوەی سەندو وای‌کرد ئوم ئەنمار داوای لێ بکـــا سەری داخ بکاو دانیشتوانی مەککەیش بە چاوی خۆیــــان تۆڵەی پەروەردگاریان دیی ••

# خەلاتی ئاسمان

موسڵمانە بێ نەواکان ئامادە بوون لەپێناوی ئیسلاما هەموو شتێ بێتە ڕێگایان .. ئامادەبوون شان شەل کەن بۆهەموو سزاو ئازارێك کە ئەهات بەبیری کافراندا ..

چیی هەیە لەوە خۆشتر کەپیاو لەپێناوی رازیی کردنی خۆشەویستیاو بەئاوات گەیشتنا بێتە ڕێی ؟! دەی موسڵمان زیاتر پێی خۆشە ، خۆشەویستیی خۆی بۆ پەروەردگاری جیهان بسەلمێنێ .. هەرچیی بێنە ڕێی هەرکەمە و زۆریش کەمە ..

چۆن کەم نیە ؟

خوای پەروەردگار ـ جل جلالە ـ قورئانی خەلاتی موسڵمان کردووە ..

قورئانی ناردووه تاموسڵمانان ـ دوای تێگەیشتنیان لێی ـ هەڵگری ئاڵای شەکاوەی رزگاریی بن ، تا هەلمەت بەرنە سەر قەڵای ستەمکاران و دەستیان لە ستەم و جەور کۆتا بکەن و کۆت و زنجیری داماوان و ماف خوراوان بپسێنن ..

قورئانی ناردووه تا بانگیان بکات بۆ گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارو مژدەی ژیانی خۆش و رابواردنی هەردوو جیهان ئەدا بەوانەی گوێڕایەڵن وەك ئەفەرموێ :

« وأن استغفروا ربكم ثم توبوا اليه يمتعكم متاعاً حسناً الى أجل مسمى، ويؤت كل ذي فضل فضله .. » (هود/٣)

بەڵێ ، موسڵمان هەردوو ژیانی هەرخۆشیی و رابواردنە بەمەرجێ بەگوێرەی فەرمانی خوا هەنگاو بنێ و لەئیسلام لا نەدا ... ئیتر با سەرانسەری ژیانی ئازار و ئەشکەنجە و کوشتن و بڕین بێ ئەو وا لەخۆشیی و کامەرانیدا ، چونکە پاڵی بە خواوە داوە ئەوی بەسە بۆ کۆمەکیی ، وەکۆمەڵی نەفامیی هەرچەندە دەستیان بڕوا ، بەلایەوە بێ‌نرخ و بێ‌هێزن چونکە دەست ڕۆیشتنەکەیان کاتییەو سەرشۆڕیی هەردوو جیهان چاوەڕوانیان ئەکات ..

بەڵام بەم بیرو هۆشەوە چەوساوەکان هاتن بەدەم ئیسلامەوە ، نەك بۆ ئەوەی مافیان دەست کەوێتەوە و لە چەوسانەوە خۆیان رزگاریان بێ .. بەڵکو لەبەر چەوت و چەوێڵیی رێبازی نەفامیی و بێ رێز سەیرکردنی بۆ ئادەمیەکان .. ئەگینا ئەو هەزارانە کە موسڵمان ئەبوون ، ئەو تۆزە ژیان و گوزەرانەی کە هەیان بوو و بڕیتیی بوو لەکولە مەرگیی ، ئەویشیان لەکیس ئەچوو و ئەکەوتنە ژێر ئازار و ئەشکەنجەوە ..

بەم بیرو هەستە پاکەوە لەئیسلام نزیك کەوتنەوە و دەوری پێغەمبەری خۆشەویستیان دا ، کەچی سەردارانی قورەیش و دەست رۆیشتووەکانی عەرەب خۆیان ئەوەندە بەرز سەیر ئەکرد بێزیان نەئەهات لەو کۆڕە ئیمانییە نزیك کەونەوە ..

ئەوەتا خەبباب بەبۆنەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٥٢)ی سوورتی (الانعام) و ئایەتی ژمارە (٢٨)ی سوورەتی (الکهف) ەوە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ :

ئەقرەعی کوڕی مابیسی تەمیمی[1] و عوینەی کوڕی حیصنی فەززاریی[2] هاتن و دیان وا پێغەمبەر ـ صلی الله

(١) ئەقرەعی کوڕی حابیسی کوڕی عوقال : یەکێکە لـــە هەوەڵان ‎••‎ وە لەسەردەمی نەفامییدا یەکێ بووە لـــە سەردارانی عەرەب ‎••‎
موسڵمان بووەو بەشداری جەنگی حونەین و رزگارکردنی مەککەو طائیفی کردووە یەکێ بووە لە « المؤلفـــة قلوبهم » وەلە مەدینە جێگیر بووە و لەســـالی ٣١ ێ کۆچییدا ئەم جیهانەی بەجێ هێشتووە
(٢) عوینەی کوڕی حیصنی کوڕی حوذەیفەی کوڕی بەدری فەززاریی یەکێ بوو لە سەرکردەکانی لەشـــــکری غەطەفان کە لەگەڵ لەشکری قورەیشدا لەشـــــکری ئەحزابیان پێك هێناو هاتنە سەر موسڵمانەکان • ئینجا پێش رزگارکردنی مەککە موسڵمان بوو و بەشـــــدای ئەویش‌و حونەین و طائیفی کردووە • ئەمیش یـــەکێ بووە لە « المؤلفة قلوبهم »
دوای مەرگی پێغەمبەری خوا یەکێ‌بوو لە هەڵگەڕاوەکان لە ئیسلام و پالی دا بە طولەیحەی کوڕی خووەیلیـــدی ئەسەدییەوە کەبەدرۆ داوای پێغەمبەرایەتیی ئەکرد ‎••‎ بەڵام عوینە کەبۆی دەرکەوت بانگی طولەیحەی کوڕی خووەیلید ساختەیە گەڕایەوە سەرئیسلام ‎••‎

علیه وسلم ـ لەگەڵ بیلال و صوهەیب و عەممار و خەبـاب
و چەند ئیمانداریکی تری بێ دەستەڵاتا دانیشتووە ، کـاتێ
چاویان پێ کەوتن بەســـووك و بێ نرخ هاتنە بەرچاویان و
هاتنەلای و پێیان وت : ئێمە حەز ئەکەین کۆڕ و دانیشتنێکمان
بۆ تەرخان بکەیت تاعەرەب لەگەورەیی و دەسـەڵاتمان تـێ
بگەن ، چونکە نێـرراوانی عـەرەب دێـنە لات و ئێمـەش
شەرمەزار ئەبین عەرەبەکان لەگەڵ ئەم بەندانەدا بمان بینن..
جا ئەگەر ئێمە هاتین ئەوان هەڵسێنە بابڕۆن وەکە ئێمەش لێ
بووینەوە ئەگەر ویستت لەسەری بوو لەگەڵیان دانیشـە
فەرمووی بەڵێ .. وتیان : دەی کەواتە نووسراوێکمان بۆ
بنووسە .. ئەڵێ : پێغەمبەریش ـ صلی الله علیه وســلم ـ
داوای پەڕەیەکی کردو بانگی عەلیی کرد تابنووسێ . ئەڵێ:
ئێمەش لە کەنارێکەوە دانیشتبووین ، هەر ئەوەندە بـــوو
جیبریل بەم ئایەتەوە هاتە خوارەوە

« ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغدوة والعشي يريدون
وجهه ، ما عليك من حسابهم من شيء ، وما من حسابك عليهم

من شيء ، فتطردهم ، فتكون من الظلمين » ( الانعام/٥٢) •
ئينجا فەرمووی
« وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا
أهؤلاء من الله عليهم من بيننا ؟ أليس الله بأعلم بالشاكرين ؟
(الانعام/٥٣) •
وە فەرمووی :

« واذا جاءك الذين يؤمنون بئاياتنا فقل سـلام عليكم •
كتب ربكم على نفسه الرحمة ••• » (الانعام/٥٤) •
پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەو پەڕەیەی
کەبەدەستیەوە بوو دای نا ، ئینجا بانگی لێ کردین و کەهاتینە
خزمەتی فەرمووی

« سلام عليكم ، كتب ربكم على نفسه الرحمة » •
بەم شێوەیە ئێمە لەگەڵیا دائەنیشتین ، جا ئەگەر بیویستایە
هەڵسێ ، هەڵئەساو بەجێی ئەهێشتین ، تا خوای گەورە ئـەم
ئایەتەشی ناردەخوارەوە

« واصبر نفسك مع الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي

يريدون وجهه ، ولا تعد عيناك عنهم تريد زينة الحيـــــوة الدنيا ••• » (الكهف/٢٨) •

خەبباب ئەڵی : ئیتر دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەگەڵمان دائەنیشت ، جا ئەگەر ئەو کـاتە بهاتایە کە ئەو تیایا هـەڵئەسا ئێمـە هـەڵئەساین و بەجێمـان نەهێشت تا ئەویش هەڵسێت ••

بەم شێوەیە یاسای ئاسمان نەحشەی نرخ و ڕێـــزی کێشا بۆ موسڵمانە کەم دەسەڵاتەکان •• بۆ موسڵمانە هەژارو بێ نەواکان ••

بەڵێ ترازووی ئاسمان جۆرێك کێشـــــــانە ئەکاو ترازووەکانی زەویش جۆرێکی تر ••

ترازووی ئاسمان دادپەروەریی و یەکسانیین بـــەڵام هینەکانی زەویی هەوەس و ئارەزووبازیی ••

ترازووی ئاسمان نرخ و ڕێز بۆ ئادەمیزاد دیاریی ئەکا بەڵام ڕێبازە دەست کردەکانی زەویی گرۆی ئـادەمیی وەك ڕانە مەڕێکی گەورە ئەداتە بەرو بۆ بەرژەوەندیی دەستبڕو

خوێنمژان ئەیدا بەدارو بەرِدا •• یاسای لارو وێر نەخشەی پرِوپووچ ، بەزم و باوی زیانبەخش پەرە پێ ئەدا ••

لەم رووداوەوە تێ ئەگەین کەوا ئەم ئاینە بێگەردە لەلایەن خواوەیە •• وەتەنها ئاینی خوا بێ لەکەیەو تەنها ئەوانەش بەراستیی خزمەتی ئادەمیزاد ئەکەن کە مێشکیان بە پەروەردەی خواناسیی پەروەردە بووە ••

چونکە هەموو نەفامێکی خوانەناس وەك ئەقرەع و عوییە بیر ئەکاتەوە و ئاوا نرخ بۆ ئادەمیزاد دائەنێ ••

جا ئەوانەی بەگوێرەی کەتەلۆکێك کە لەگەڵ ئەم دروست کراوانەدا هاتووە کار ناکەن ، ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر تێکدەرو روخێنەری قەڵای مرۆڤایەتین •

•• چونکە مێشکی نەفامیی بەنجکراو و لە کارکەوتووە، وە هیچ سۆزو بەزەییەك نییە ویژدانی ئەو بسزوێنێ •• ئەوپەرِ ئاواتی خۆپەرستیی و خۆ بەگەورە گرتنە لە سەرحسابی کەسانی تر ••

جا قورئانی پیرۆز دەرمانە بۆ چارەسەریی نەخۆشیە جۆر بە جۆرەکانی دەروونــی ئادەمیەکــان وە هــەرکەس ئەیەوێ لە نەخۆشیەکانی ئەم ژیانە رزگار بێتو ژیانی هەتا هەتایش مسەوگەر کات با لە دەرمانخانەی قورئانی پیـرۆز دەرمان وەرگرێت •

جا ئەوەشمان زانی کە بیروهەست و هۆشی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ، تا خوا ویستی لەسەر نەبێ، بەو هەموو خۆشەویستییەوە ، هیچ دەورێکی نیە لەم بەرنامە خواییەدا ••

بەڵێ •• ئیسلام بەرنامەی خوایە ـ جل جلاله ـ هەتا پێغەمبەری ئازیزیش ـ صلی الله علیه وسلم ـ بۆی نیـــــە بەهیچ کارێك هەڵسێ بەبێ فەرمانی خوا •• پێویســـــــتە فەرمان لەئاســمانەوە وەرگــرێ •• وەبەتــەمای خــوا بێت نەخشەی سەرکەوتنی بۆبکێشێ !

لەسەرەدەمی بانگەوازەوە پێغەمبەری خوا ـ صلی اللــە علیه وسلم ـ زۆر بە پەرۆش بــوو تا خــەڵکیی بێن بــەدەم

بانگەوازەکەیەوە ، وە هەتا ئەوەبوو بۆ رازیی کردنی چەند سەردارێك ئەیویست موسڵمانە هەژارەکان لەخۆی دوور بخاتەوە .. زۆر دڵگران بوو کەوا پیاو ماقوول و ناودارانیمان نەهێنن بە بانگەوازەکەی ، وەك وابزانێ سەرکەوتنی ئیسلام بەستراوە بەو دەست رۆیشتووانەوە ، قورئانیش خێرا خێرا پەروەردەی ئەکرد .. بەپێی پێویست ئامۆژگاریی بۆ ئەهات تائارام بگرێ و دان بگرێ بە خۆیا و نەخشـــەی سەرکەوتن بداتە دەست خوا .. وە ئەو ئەوەندەی لەسەرە فەرمان جێ بەجێ بکاو بەدوور کـــەوتنەوەی گومڕایان دڵ زویر نەبێت .. چونکە ئەمە ئاینی خوایەو خۆی چـاك ئەزانێ چۆن سنەمکاران لەناو بەرێت و ئاینەکەی سەرخات..

ئینجا کە موسڵمان بیر لەو هەڵوێستە دڵتەزێنە ئەکاتەوە کا دوو پیاوی دەسەڵاتـدار بێن و بەزمانی لـووس وگـاڵەو هاس و لووش بیانەوێ پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليـه وسلم ـ موسڵمانە هەژارەکان لە خۆی دوور بخاتـەوە تـا بۆ ئـەوان شوورەیی نەبێ لەلایا دانیشن ، لەولاشـەوە وسڵمانە بێ دەستە هەژارەکان لەدوورەوە و لەلایـــەکی

کۆرەکەوە کزیان کردووەو تەپەی دڵیان دێت و چاوە پاکەکانیان بڕیوەتە پێغەمبەری ئازیزیان تۆ بڵێی ئەم پارچە کاغەزە بنووسێ‌و ئەوان دوور بخاتەوە ؟ ئا لەم کاتە ناسکەدا قورئان دێتە خوارەوە

ئەی موحەممەد نەکەی •• نەکەی ئەو بڕیارە بدەی ! موسڵمانە هەژارەکان کە دڵیان بەستراوە بە خواوە و بەپاکی و بەراستیی شوێن ئیسلام کەوتوون دەرنەکەیت •• ستەمە ستەم •• !

کاتێ موسڵمان ئەو هەڵوێستە دێنێتە پێش چاوی هەست بەنرخی ئادەمیزاد ئەکات ••

هەست بەبوونی ئادەمیزادو مافەکانی ئەکات ••
هەست بە یەکسانیی ئادەمیزاد ئەکات ••
هەست بەرزگاریی ئادەمیزاد ئەکات ••
هەست بە سەربەستیی ئادەمیزاد ئەکات ••
هەست بەرمانی قەڵای ستەم ئەکات ••
هەست بە تیاچوونی ستەمکاران ئەکات ••

سوپاس بۆ تۆ خوایە •• سوپاس لەسەر بەخششە لە ژمارە نەهاتووەکانت ، بەتایبەت لەسەر ئەم ئایینە بێگەردە ••

سوپاس بۆ تۆ خوایە •• وا ئایینەکەت بەستراوە بەدڵی پاك و نیەتی پڕ لە دڵسۆزییەوە •• نەك ڕواڵەتی دنیاو گانەو قاشە و لووسەوە •••

خۆزگەم پێتان مامۆستا بەڕێزەکانم ، ئەی یەکـــەم هەڵگری ئەم ئایینە بێگەردە ، ئەی موسڵمانە بێ دەسەڵاتە دڵ بەستراوەکان بە خواوە •

خۆزگەم پێتان بێ وا ئەوەندە لەگەڵ خـودادا راستتان کرد تا لەسەر ئاسمانی حەوتەمـەوە رەحمـەتی خـوی رژا بەسەرتانا ••

خۆزگەم پێتان بێ ئەی چەوساوەو ماف خوراوەکانـی سەرانسەری سەرزەویی لەهەمووکات و شوێنێکا بۆ ئــەم ڕەوایەی کە خوای دروستکەر بەئێوەی بەڕێزی بەخشی •• دەزووکەن بێن بەدەمیـەوە و مرۆڤایـەتیی لەستەمکاران رزگارکەن •

ئینجا موسڵمان زیاتر خۆشیی ئەرژێ بەسەر دڵیا کاتێ سەیر ئەکا خوای پەروەردگار هەربەوە رازیی نابێ لە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ـ صلی الله علیه وسلم ـ کەوا موسڵمانە هەژارەکان دەرنەکات و لەخۆی دووریان نەخاتەوە بەڵکو فەرمانی بەسەرا ئەدا کە هەرکاتێ لەگەڵیان دانیشت هەڵنەسێ و بەجێیان نەهێڵێ ، تا ئەوان هەڵسن و برۆن ئەوسا ئەمیش هەڵسێ ..

بەجێیان نەهێڵێ تا دڵیان لەخۆیان دانەمێنێ !
.. بەجێیان نەهێڵێ تاهەست بەکەمیی خۆیان نەکەن !

ئارام بگرێ و دان بگرێ بەخۆیا تائەوان لەو دانیشتنە لە فەرمایشتەکانی تێربخۆن و هەڵسن ئەوسا ئەمیش هەڵسێ

بەراستیی موسڵمان خاوەن نرخە ..
بەراستی تەنها موسڵمان خاوەن نرخە..تەنها موسڵمان..

لەچ سەربازگەیەکدا ئەمە لێك ئەدرێتەوە ئەوانەی لە ئیسلام رایان کردووە بەناوی ماف و رێزەوە ، با پیاوەتی

بکەن و دەست نیشانێکی ئەوماف و رێزە بۆئێمەیش بکەن ..

جا ئەگەر نییەو ناتوانن دەست نیشانی بکەن دەبـــا بگەرێنەوە بۆ لای قورئان و واز لە فڕوفێڵ و تەڵەکەبازیەکەیان بهێنن .

بەڵێ ئەوانەی بانگی خەڵکی ئەکەن بۆسەر تــوولــە رێگاکان تائێستە چییان کردووە بۆ مرۆڤە ماف خوراوەکان ؟!

کامیان دەستی ڕۆیشت و هەژار و بێ نەواکانی لە یاد بوو ؟!

کامیان دەسەلاتی گرتە دەست و خوێنمژینو ســـتەم و جەوری نەکردە پیشەی ؟ .

مێژووی هەزار ساڵەی ئادەمیزاد شاهیدە و لەبـــەر چـاوە !!

# لەسایەی قورئانا

خەباب بەفەرمانی پێغەمبەری ئازیز کۆچی کرد بـــۆ مەدینەو بووە برای ئەنصارە خوا ناسەکان ، تاماوەیەکە زۆر بحەسێتەوەو بە سەربەستیی خواپەرستیی خۆی بکات و بێخەم لە سزاو ئازاری ئوم ئەنمار و خزمەکانی لەگەڵ پێغەمبـــەرا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بە خۆشیی و کامەرانیی ژیان بداتــە سەر • تا ئەوەبوو جەنگی بەدر هاتە پێشـــەوە و مەردانـــە بەشداریی تیا کرد تا ئالای کوفر بێنێتە خوارەوە •

هەروەها بەشداریی جەنگی ئوحودی کـرد و لەوێیش بە ئاواتێکی تر گەیشت ، کە ئەوە بوو بەچاوی خۆی چـاوی لێبوو سیباعی برای ئوم ئەنمار بەدەستی پێشەوای شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب کـــوژرا و بــە دۆزەخ

گەیێنرا .. ئەو سیاعەی کە بەوپەڕی بێویژدانییەوە ئـازاری ئەدا ، وا گەیشت بە ئەنجامی خۆی ..

خەبباب ژیا تاسەردەمی هەر چوار خەلفەکەی ئیسلام و بەوپەڕی ڕێزەوە لەسایەی دەوڵەتی قورئانا ژیانی دایـــەســــــەر ..

جارێکیان چووەلای عومەر لەکاتێکا کە خەلیفەبـوو ، ئەویش ڕێزێکی چاکی لێ گرت و لە شـوێنێکی شـــیاوا و لەنزیکی خۆیا دایناو پێی فەرموو

جگە لە بیلال کەسی تر لەتۆشیاوتری ئەم شوێنە نییە..
ئینجا خەلیفە داوای لێ‌کرد تا بەتینترین سزاو ئـازاری کافرەکانی مەککەیان بۆ بگێڕێتەوە ..

خەبباب شەرمی ئەکرد وەڵامی بداتەوە ، وە گێڕانەوەی سزاو ئازاری ئەوماوەیە بەخۆهەڵکێشانی ئـەزانی ، بـەڵام خەلیفە وازی لێ نەهێناو چەندجارێ داواکەی دووبـــارە کردەوە تا خەببابی ناچار کرد و ئەویش کراسەکەی بـەری داکەندو پشتی خۆی رووت‌کرد ، کاتێ عومەر ئەمەی دیـــی

دەمو چاوی هێنایەوە یەكو پرسیی
ئەمە چۆن وای لێ هاتووە ؟!

وتـــی :

جارێکیان بت پەرستەکان ئاگرێکی گەورەیان کــردەوە و وازیان لێ هێنا هەتا دامرکایەوەو بوو بەپشــکۆ ، ئینجــا جلەکانیان لەبەرا داکەندم و بەسەرپشتا بەســەر ئاگرەکەدا رایان کێشام ، هەتا گۆشتی پشمم لە ئێسقانەکانی جیابوویەوە و کەوتە خوارەوە .. ئینجا ئەوەندە ئاوو چەوریی لەلاشــەم هاتە خوارەوە تا ئاگرەکەی کوژاندەوە ! بەو شێوەیە رێبازی چەوت و دڕندە بەرگریی لێ کراوە .. وە مێژووی نەفامیی جگە لەم کارە نامەردانە ئەبێ چی تری تیابێ دیارە خەبباب تاقە موسڵمانێکە وا داخ ئەکرێ ، بەڵام خۆ لەئەندەلوســـی موسڵماندا گاوران بە هەزارەها موسڵمانیان بەیەکجـــاریی سووتاند ! خۆ هۆلاکۆ بە ملیۆنەها موســـڵمانی بەنــاڕەوا کوشــت !!

خو ..... هتد

بەڵام کوان ؟ کامیان نەنۆڵەی پەروەردگار رزگاری بوو ؟! کامیان سوکیی هەردوو جیهانی بەسەر نەهات ؟!

دوای ماوەیەك خەبباب هاتە کووفەوە و تیایا مایەوە و دەستی کرد بە خواپەرستیی و بەخزمەتی ئیسلام وەهەر لەوێش کۆچی دوایی کرد •

خەبباب لەپێشەوە هەژار بوو ، بەڵام ژیانی خۆش و پڕ لە کامەرانیی سایەی قورئان ئەمیشی وەك ئەندامانی تری کۆمەڵ دەوڵەمەند کرد •••

ئەمیش لەسایەی حوکمی دادو یەکسانییدا بە کاسپیی حەڵاڵ دەوڵەمەند بوو • چونکە ئەو رۆژە نەمابوو هەندێ هەندێ بچەوسێننەوە و لەژیان بێ بەشیان کەن و بەناڕەوا دەست بگرن بەسەر سامان و بەروبوومدا ••

لەسایەی قورئاندا هەموو ئادەمیزادێ بۆی هەیە بە سەربەستیی و بەشێوەیەکی شەرعیی هەوڵی کاسپی حەڵاڵ بدا •• ئینجا با ئەو خەیرو بەرەکەتە بووەستی کە خوا ـ جل جلاله ـ ئەیرژێنێ بەسەر کۆمەڵی خواناسدا ••

بۆیە خەبابیش بووە خاوەنی ئاڵتوون و زیوێکی زۆر بە شێوەیەك هەرگیز نەهاتووە بەبیریا ئەوەنـــدەی بێ

دەوڵەمەنـدیش بەهرەیەکـە و خوا ـ جل جلالـه ـ ئەیبەخشێ بەهەندێ لەبەندەکانی ٠٠ دیارە ئەم بەهـرەیەش وەکو بەهرەکانی تر تاقیکردنەوەیە و هەروا هەوانتە نییە ٠٠ جا خۆزگەم بەوانەی لـەو تاقی کـردنەوەیـەدا دەرئـەچن و سەرفرازی هەردوو جیهان ئەبن ٠٠

جا بابزانین خەبابی هاوەڵی پێغەمبەر کە دەوڵەمەند بوو، چی ئەکا لەپارەکەی ؟

تۆ بڵێی سزاو ئازارو ژێر دەستەیی و هەژارییەکـەی مەککەی لەبیر بچێتەوە ؟

خەباب چاك لە قورئان گەیشتبوو ، بۆیە بە شـێوەیەك رەفتی کرد هەرگیز نەهاتووە بە بیری کەسدا !

پارەکەی لە شوێنێکی تایبەتییدا دانا تا دەستی هـــەموو هەژار و دەست کورتێکی بگاتێ ٠٠ بێ ئەوەی بیشارێتەوە ، وە یا دەرگای لەسەر داخا ، بەمە هەژاران و دەست کورتان کە پێویستییان بە پارە بووایە خۆیان بێ پرس ئەچوونە سەر

پارەکەو چەندێکیان بویستایە لێیـــان ئـــەبرد •• لەولاوە خەبباب هێشتا ئەترسا لەسەر ئەم دەوڵەمەندیی و دەســـــت رۆیشتنە سزا بدرێت •• لێرەدا ئەبێ سەرنجی ئـەم کـــارەی خەبباب بگرین •• لەراستییدا کارێکی بێوێنەیە ، چونکـــە نەماندیوە و نەمانبیستووە هیچکەس پارە و سامانی خۆی کـــە بە رەنجی شان و عارەقی ناوچەوان پەیدای کـــردبێ وەها هەموو هەژار و بێ نەوایەك خۆی بە خاوەنی بزانێ و پاش ئەوان بۆ خۆی بمێنێتەوە •

بەلام ئەم کارە بێوێنەیە ئازایەتی خەبباب نییە بەتەنیا •• چونکە وەك خەبباب خاوەنی سامان نەبوو بەرامبەر بــە بــرا موسلمانەکانی ، هەروەهاش موسڵمانەکان خاوەنی ویـــژدان بوون ، هەتا پێویستییان نەبووایە و دانەمانایە دەستیان بـۆ نەئەبرد و نە پارەشیان بردایە بە پێی پێویست ئەیان برد •• دیارە ئەمەش تەنها لەسایەی کۆمەڵی قورئاندا بەدیی ئەکرێ و بەس •• وەك پێشینە وتوو یانە چـــەپلە بە یەك دەس ناکوترێ ، هەتا موسڵمانەکان بە جوانیی شـــوێن قورئـــان نەکەون ناتوانن کاری سەیرو مەردانەیان لێ بووەشێتەوە

نابنه پێشمه‌نگی کاروانی گه‌لان و به‌ره‌و رێبازی قورئـــان هیدایه‌تیان بده‌ن ..

وتمان خه‌بباب زۆر ئه‌ترسا له‌سه‌ر سامانه‌که‌ی ســـزا بدرێت هه‌رچه‌نده به‌و شێوه‌یه‌ی پێ ئه‌کرد

کۆمه‌ڵێ له هاوه‌ڵه‌کانی ئه‌گێڕنه‌وه و ئه‌ڵێن جارێکیان چووینه لای خـــه‌بباب که له نه‌خۆشــیی سه‌ره‌مه‌رگیا بوو و وتی

له‌و شوێنه‌دا هه‌شتا هـــه‌زار درهـــه‌م هـــه‌یه ، به‌خـــوا هه‌رگیز نه‌م شاردۆته‌وه و هه‌رکه‌سێ پێویستیی پێی بووبێ به‌رم نه‌گرتووه ، ئینجا ده‌ستی کرده گریان ..

پێیان وت چییه وا ئه‌تگرێنێ ؟!

وتـــی :

بۆ ئه‌وه ئه‌گریم هاوه‌ڵه‌کانم جیهانیان به‌جێ هێشــت و له پاداشتی کرده‌وه چاکه‌کانیانا هیچێ له‌م دنیایه‌یان ده‌ســت نه‌که‌وت ، وه وا من ماوم و ئه‌م سامانه‌م ده‌ست که‌وتـــووه و ئه‌ترسم له‌پاداشتی کرده‌وه‌کانما بێت ..

واته هیچ چاکەیەکم بۆ نەمێنێتەوە لەقیامەتا ..

خەبباب لە کووفەدا مایەوە تائەوە بوو بەر لەوەی جەنگی صەفین رووبدا خەبباب تووشی نەخۆشییەکی گران بوو کەوا نەیتوانی بەژداریی جەنگەکە بکاو یەکەم هاوەڵ بوو وەسێتی کرد لەدەرەوەی شاری کووفە بینێژن .

کاتێ کەبە سەری بەرزەوە جیهانی بەجێ هێشت و دەستی کرد بە گەشتی ژیانی تازە و چووە ژێر رەحمەتی خوا لە بەهەشتا ، لەدەرەوەی شار لەنزیك دەرگای شازدا سپێررا بەگڵ ، کە ئیمامی عەلیی - خوا لێی رازیی بێت - لەجەنگ گەڕایەوە ، هەواڵیان دایە کە دوای ئەو خەبباب کۆچی دوایی کردووە ، ئیمامیش نوێژی لەسەر کردو ئەنجا لەسەر گۆڕەکەی وەستاو فەرمووی

خوا رەحم بکا بە خەبباب ، بەراستیی بەویستی خۆی موسڵمان بوو ، وە بەگوێڕایەڵیی کۆچی کرد ، وە بە جیهادەوە ژیانی بردە سەر ، وەخوا هەرگیز پاداشتی چاکویستان و چاکەکەران نافەوتێنێ ..

بەم شێوەیە خەبباب ـ خوا لێی رازیی بێت •• لەتەمەنی شەست و سێ ساڵیدا ، وەلە ریوایەتێکا لەتەمەنی حەفتاو سێ ساڵیدا ، لەساڵی سیی‌وحەوتی کۆچییدا ، تەمەنی پیرۆزیی تەواو کرد ••

تەمەنێ کە هەمووی فەڕو پیرۆزیی بوو بۆ بەرپا کردنی کۆمەڵی موسڵمان و دامەزراندنی پایەی دەوڵەتی قورئان تا مرۆڤایەتیی لەسایەیا بحەسێتەوە ••

تەمەنێ کە بەخوا پەرستیی و چاکەویستیی رازاندبوویەوە ، تا دڵ و دەروونی پەروەردە بکاو ببێتە نموونەی سەربازی موسڵمان ••

بەڵێ ، خوشك وبرا موسڵمانەکانم ، خوا رەحم بکا بە خەبباب و بە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خۆشەویست ، وەکۆمەکیی ئێمەیش بکا تا بکەوینە شوێن ڕێبازە سەربەرزکەرەوەکەی ئەوان ، تا بە پشتیوانیی خوای گەورە وەك ئەوان لە هەردوو جیهاندا سەرفراز بین •

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# سەرچاوەکان

| پەڕاو | دانەر |
|---|---|
| التـــاج | منصور على ناصف |
| صور من حياة الصحابه | عبدالرحمن رأفت الباشا |
| الاســـتيعاب | ابن عبدالبر |
| حياة الصحابة | الكاندهلوي |
| الاصـابة | ابن الحجر العسقلاني |
| صـفة الصـفوة | ابن الجوزي |
| حلية الأولياء | الاصبهاني |
| أسـد الغابة | ابن الاثير |
| القصص الاسلامية | احمد بن حافظ الحكمي • |

# چاپکراوەکانی نووسەر

أ ـ زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

١ ـ عومەیری کوڕی سەعد •

٢ ـ نوسەیبەی کچی کەعب •

٣ ـ ئەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف

٤ ـ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود •

٥ ـ ئەبوو ئەیوبی ئەنصاریی •

٦ ـ خوبەیب و سەعید •

٧ ـ ئەبوو طەڵحەی ئەنصاریتی •

ب ـ زنجیرەی وت و وێژی قوتابیان

١ ـ میش بووە پشتیوانی •

٢ ـ تاکەی دوورە پەرێزبم ؟

# ناوەرۆک

# ئەم نامیلکەیە

● دەسی موسڵمان ئەگرێ تابزانێ چۆن دەست بە ئیسلامەوە بگرێت .. تابزانێ ئەرکی سەرشانی چییە .. وەکە ئەم ڕێبازە هەڵئەبژێرێت داوای چیی لێ دەکات .

● موسڵمان تێ ئەگەیەنێ کەوا خۆشی و کامەرانیی و ئاسوودەیی کۆمەڵ و جۆریی بەش و پارچە کانی لە سایەی ئیسلامدا دێتە دی ..

● وە موسڵمان تێ ئەگەیەنێ زۆرانبازیی نێوان ئیسلام و کوفر زۆرانبازیەکی کۆتایی نەهاتووە و کافران هەرگیز درێغیان لە خراپە نەکردووە و خوایش هەمیشە کردوونیە پەندی زەمانە ..